# زەھا

گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە

ژمارە (2) پێنج شەممە 1/2/2018


زنجیرە بابەتی

# فەزل و گەورەیی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت

د.ابراهیم هەرشەلی

**خاوەنی ئیمتیاز :**

**- ئەیاد نادر**

Ayadqadr10@gmail.com

**بەڕێوەبەری گشتی :**

**- ئاوارە کاوێس**

malaawarakawes@gmail.com

**سەرنووسەر :**

**- زامدا ر قادري**

Muhammadibrahim9232@gmail.com

**بەڕێوەبەری هونەري :**

**- ا ركا ن صديق بەقال**

Arkanbaqal1990@gmail.com

**دیزاین :**

**- بلال برزنجی**

bilalbakr.1995@gmail.com




# ڕەهــــا بــۆچــی ؟

لە سەروبەندی زیاد بوونی گروپە جیاوازەکان و سەر لێ شێوانی تاکی موسڵمان لە نێوانیاندا، پێمان باش بوو گۆڤارێکی ئەلکترۆنی دەربکەین تاوەکو تاکی مسوڵمان بە ئیسلامە ڕاستەقینەکەی شارەزا بکەین، پێناسەی ئیسلامە ڕەسەنەکەی بۆ بکەین، ئەو رووحیانەتەی کە لە باب وباپیری دەیبینی و ئێستا لە کەسدا بەدی ناکات، ئێمە هەوڵ دەدەین ئیسلامی بەو جۆرە پێ بناسێنین

ڕەها بۆ ئەوەیە خەڵك بەرەو دیدێکی ناوەندگیر ببەین، وایان لێ بکەین گفت و گۆی بنیاتنەر بکەن و یەکتریان خۆش بوێ ئەگەر چی راشیان لە یەکتری جیاواز بێ

ڕەها بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان بە فیترەتی خۆیان ئاشنا بکرێن، لەگەڵ ئاشنا کردنیشیان بە بابەتە سەردەمییەکان و دانەبڕان لێیان، لەگەڵ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانەی لە رۆشەنبیری تاکی خوێنەردا هەن و بۆ ئەوەی دونیا بینیان جوانتر بکەین

لەو پێناوەدا، رەها لەدایك بوو، سەرەتا بیرمان لە چاپکردنی گۆڤارەکە کردەوە، بەڵام دوای راوێژ لەگەڵ دەستەی نووسەران گەیشتینە ئەوەی کە باشترین و ئاسانترین رێگا بۆ بڵاوکردنەوە، رێگای ئەلکترۆنییە، لەهەرشوێنێکی ئەو دونیایە بێت خوێنەر بەدەستی دەگات

هیوا خوازین پەروەردگار لەم کارە سەرکەوتوومان بکا و ئەو بڵاوکراوەیە ئامانجی خۆی بپێکێ

بۆ هەر رەخنە و پێشنیارێك دەتوانن بەم ئیمەیلەی خوارەوە ئاگادارمان بکەنەوە
Govari.raha@gmail.com

دەستەی نووسەران

# فەزل و گەورەیی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت



فەزل و گەورەیی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت بەسەر پێغەمبەران و تەواوی مرۆڤەکان بە ڕوونی باس دەکەین، چەندەها بەلگەی لەسەرە کە قورئان و فەرموودەی صحیحی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت وە کۆ دەنگی تەواوی زانایانی ئیسلامی لەسەرە وەك پێشەوا قازی عیاز دەفەرموێت ((تقرر دليل القرآن، وصحيح الاتر، و اجماع الأمة كونة أكرم البشر و أفضل الأنبياء)) بەلام زۆر جار موسلمانان دەخرێنە گومانەوە لە باسی گەورەیی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت باس کردنی هەر جۆرە کەمالات و تایبەتمەندیەك و فەزڵدانێکێ بەسەر پێغەمبەراندا بە کارێکی بڤەو نادروست لە قەلەم دەدرێت، وە بۆ دروست کردنی ئەم جۆرە گومانانە بەشێکی کەم و پچڕی فەرموودەیەکی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەکەنە بەلگە، بێ ڕەچاو کردنی هیچ بنەمایەکی تەفسیر و یاساکانی لێکدانەوەی دەق، وەکو فەرموودەکانی ((لا تطروني،كما أطرت النصاري ابن مريم، فإنما أنا عبده، فقولوا عبد الله، ورسوله)) ((لا تفضلوا بين الأنبياء)) (( لا ينبغي لعبد أن يقول : أنا خير من يونس بن متي)) زانایان بۆ لێکدانەوەی ئەو فەرموودانە چەند ڕاڤە کردنێکیان هەیە، چونکە نابێت واتای ئەم فەرموودانە وا لێك بدرێنەوە کە فەرمان بە باوەڕ بوون بە یەکسانی پێغەمبەران دەکات چونکە پێچەوانەی ئەو ئایەتە راشکاوانەیە کە باسی پلە و پایەی پێغەمبەران دەکات، وەك ئایەتی (( تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ)) ((البقرة 253)) واتە) ئەوە جەماعەتی پێغەمبەرانە بازێکیانمان تەفزیل داوە بەسەر بازێکیانا ، لەو پێغەمبەرانەیە کەسێ کە خوا قسەی لەگەل کردووە بێ واسیتەی فریشتە وەکو (حەزرەتی موسا) لە کێوی (توور) دا وە (حەزرەتی محمد موستەفا) لە شەوی (میعراجا) وە بازێکیانمان بەرز کردۆتەوە بەسەر باقیەکانا بە چەند پلە و پایە وەکو حەزرەتی محمد لە پایەکانی دەعوەت و عموومی دەعوەت و دەوامی دین و دەرەجاتی میعراجا خودا بەرزی کردەوە، وە داومانە بە عیسای کوری مریەم چەند موعجیزەی گەورەی وەها کە ئەبن بە شاهید لەسەر ئەوە پێغەمبەری خودایە ).(تەفسیری نامی) وە ئایەتی (( وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ، وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّنَ عَلَيٰ بَعْضٍ ، وَءَاتَيْنَا دَاوُدَ زَبُورًا)) (الإسراء 55 ) واتە: (نەك تەنیا بە خالی ئەو کافرانە بەلکوو خودای تۆ زاناترە لە ئێوە بە هەر کەسێ کەوا لە ئاسمانەکانا یا وا لە عەرزا لە پێغەمبەران و غیری پێغەمبەران و لە موسلمانان و کافران وە ئادەمیزادانەیشم وا دروست کردووە بازێکیانم کردووە بە پێغەمبەر بۆ لای بازیکیان ولەو پێغەمبەرانیشدا بازێکمان پایە پێداوە بەسەر بازێکیان ، وە زەبوریشم داوە بە داوود و داوود پێغەمبەرە و گومان مەبەن کە مەسێك گەورەیی و سەرۆکی ببێ و نابێ بە پێغەمبەر نەخێر خودا خۆی ئەزانێ کێ هەلئەبژێرێ بۆ گەورەیی لە دنیادا یا لە دینا )(تەفسیری نامی) پشتوان بە پەروەردگار لە ژمارەکانی داهاتوو بە بەلگەی ڕۆشن و ئاشکرا دەیخەمە بەر دیدەتان



د.ابراهیم هەرشەلی



# لە گوڵستانی عاریفانەوە



دووەم دەرگای چونە نێو ڕێگای عاریفان بریتیە لە تێکۆشان ( المجاهدە ) ی نەفس پەروەردگار دەفەرموێ ( والذين جهدوا فينا لنهدينهم سبلنا و إن الله لمع المحسنين) عنكبوت ٦٩ " عەبدلرەحمانی سلمی " لە تەفسیری ئەو ئایەتە ئەڵێت (والذين جهدوا ) واتا : لە ڕێگای گەشتن بە ئیمە تێکۆشان (لنهدينهم سبلنا) واتا : ئێمەش ریگای گەشتن بە ئێمەمان خەڵات کردن " عەبدوڵای کوڕی موبارەك " لە تەفسیری ئایەتی ( وجاهدوا في سبيل الله حق جيهادە " ئەڵێت : ئەحەقترین جیهاد لە پێناو خودا جیهادی نەفسی ئینسانە . لە فەرمایشتی شیرینی خۆشەویست (درودیخوای لێبێ ) هاتووە فەرموویەتی : ( موجاهید ئەو کەسەیە کە جیهادی نەفسی خۆی دەکات لەبەر خودا ) مسند احمد ٢٣٥٩١ بۆ گەیشتن بە ڕێگای عاریفان پێویستە سەرەتا کۆچ بکەی لەو کردەوە ناشرین و دزێوانەوە بەرەو پاکی و ڕەوشت بەرزی و تێبکۆشی لەگەڵ نەفسی خۆت دا تاکو بەسەری زاڵ ببیت و لە هێرشی حەز و ئارەزوو دوربکەویتەوە ، شێخ " ئەبو عوسمانی مەغریبی " دەڵێت : هەر کەس بیەوێت شتێك لە ڕیگای عاریفان بەدەست بهێنێت و بەرەکاتی ئیلاهی بەسەر دابرژێت بە بێ تێکۆشانی نەفس ، ئەوا لە هەڵە دایە . گوێیان لە " بایەزیدی بوستامی " بوو دەیگوت ( دوانزە ساڵ ئاسنگەری نەفسی خۆم بووم ، پێنج ساڵ وەکو ئاوێنە بووم بۆ دڵی خۆم ) لە کاتێك بایەزید لەوپەڕی تەقوا و عیبادەت دابوو بەڵام ئەترسا لە نەفسی خراپ کە توشی غەزەبی پەروەردگاری بکات بۆیە هەمیشە لە کێشمەکێش و شەڕی نەفس دا بوو . عاریفان وەکو هەمیشە لە پیشەنگی زەلیل کردنی نەفسی خۆیان دابونە لە کاتێ کەس وەکو ئەوان نەبووە چۆن مرۆڤ ئاوایە کە هەمیشە و زۆربەی کات کراوەیە بە ڕووی گەورەکردن و خۆشویستنی نەفسی خۆی ، ئەوەتا شێخ " سری سەقەتی " دەیگوت : ( ئەی گەنجەکان ، تێبکۆشن لەگەڵ نەفس و ئارەزوو بەر لەوەی تەمەنتان وەکو هی منی لێبێت ، ئەو کات بێ توانا دەبن و ناتوانن و کەمتەرخەم دەبن وەکو چۆن من ئێستا کەمتەرخەم بووم ) لەو کاتەی کە ئەو فەرمایشتەی فەرموو شێخ جونەید دەلێت ، کەس وەکو سری عیبادەتی نەدەکرد ، تەنانەت یەك گەنجیش نەدەگیشت بەو لە عیبادەت " ئەبو عەلی ڕۆزباری " دەڵێت : ئەگەر لە دوای پینج ڕۆژ نان نەخواردن کەسی سالیك بڵێت، برسیمە! ئەوا ڕەوانەی بازاڕی بکەنەوە پێی بلێن با کەسابەت بکات . ئەوە بزانە کاتێ شەڕی نەفس دەستی پێ دەکات ، نەفس هەموو توانای خۆشیەوە ڕووت تێدەکات و ئەیەوێت خۆیت لا شیرین بکات تاکو دەستبەرداری تێکۆشان ببیت بەڵام لەبیرت بێت کاتێ ویستی حەز و ئارەزووەکانت لەلا شیرن بوو و دونیات لا ڕەنگین بوو ، ئەبیت ئەوکات بە لغاوی تەقوا لغاوی بکەیت و بیبەستیەوە ، کاتێ نەفس شتێك لەگەڵی یەك ناگرێت تورە دەبێت لەبەرامبەرەکەی ، ئەبێت ئەوپەڕی توندی بنوێنی و ئاقڵانە بیر لە قیامەت بکەیەوە کە نەفس و حەزەکان بەرەو کوێت دەبەن ؟ بێگومان دۆزەخ . بۆیە ڕێگای نەدەیت بەسەرت زاڵ بێت ، بەڵام گەر ئەمانەت نەکرد ئەوە ئەبێ بزانیت لە ڕێگای عاریفان ئیدی جیگایەکت نامێنێ و لە تاڤگەی پڕ ئەوینی ڕیگاکەیان بێ بەش ئەبی و ئاسودەی گیان و ڕۆحی لە دەست ئەدەیت . تێکۆشان ڕاستە ونە و ڕەنگە نەزانیت لە چیەوە بۆت ئاشکرا ببێت کە کامە ریگا تاقی بکەمەوە بۆ بەرەنگار بوونەوە و تێکۆشان ؟ لەمەو پیش هەندێم لە فەرمایشتی عاریفان بۆت گێڕایەوە دڵنیام ئێستا ئەزانیت کە چی ئەکەیت ، بەوەندەش ناوەستم و هیشتا ڕونتری ئەکەمەوە لەو فەرمایشتەی شێخ " ابراهیمی غەواس " دەڵێت : بۆ زاڵ بوون بەسەر نەفسدا هەر شتێك کە نەفسم لێی بێزار بووە ئەوا ئەنجامم داوە . ئینجا تێگەشتیت کە ساناترین ڕیگا تەنیا ئەوە بکە کە نەفست پێی ناخۆشە . با دەست لەناو دەستی عاریفان دابنێن و دەست بە تێکۆشانی نەفس بکەین تاکو لەم کاروانە پڕ لە ئارامیە دانەبڕێین و لەگەڵ عاریفانی مەزن جێگەمان جەنناتی پڕ لە شادی پەروەردگار بێت و لە خزمەت ئازیزمان حەزرەتی نازدار (درودیخوای لێبێ ) بەیەك بگەینەوە



زامدار قادری

# چۆن کتێبی گونجاو هەڵدەبژێری بۆ خوێندنەوە؟



لەم سەردەمەدا کە زۆرێك لە کتێبەکان نووسراون، دەربارەی هەر بابەتێك لەبابەتەکان بەدەیەها کتێب نووسراو ، ئەمەش وای لە خوێنەری کتێب کردووە کە تووشی دوودڵی بێت لە هەڵبژاردنی ئەم کتێبەی کە دەیەوێت بیخوێنێتەوە ، نازانێ کامە کتێب بخوێنێتەوە وە کامەی هەڵبژێرێت . بۆیە لەم نووسینەدا بە پێی پێویست باسی ئەو هۆکارانە دەکەین کە یارمەتی خوێنەران دەدات لە هەڵبژاردنی کتێبی گونجاو :-

1 جۆری کتێبەکە :- جۆری کتێب بەپێی جۆری ئەو بابەتەی کە دەربارەی نووسراوە دەگۆڕێت ، زۆر بوار هەیە کە کتێبی دەربارە نووسراوە وەك { ڕۆمان ، ئەدەب ، مێژوو ، جوگرافیا ، زانستی ، ئاینی .....} دەبێ لەیەکەم هەنگاوت جۆری کتێبەکە هەڵبژێریت کە دەتەوێ بیخوێنیتەوە ، ئەگەر تۆ لە کتێب خوێندنەوەدا تووشی بێزاری دەبووی ئەوا بواری ڕۆمان گونجاوە بۆ ئەوەی بخوێنیتەوە ، ئەگەر تۆ کەسێکی کتێب زوو کاریگەری لەسەر ت دەبێ ئەوا بوواری دەروناسی و گەشەی مرۆیی بخوێنەوە ، ئەگەریش حەزت کرد دەتوانی لە بابەتی خۆتدا بخوێنیتەوە ، بە پێی توانا و حەز و وویستت جۆری کتێبەکان دەگۆڕێت .

2 پلەبەندی :- هەندێك لە کتێب هەیە کە بە باشترین کتێب دادەنرێت یان بە پڕفرۆشترین کتێب یان بەهێزترین کتێب ، بۆیە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە دەیەوێت کتێب بخوێنێتەوە پسیار لەو کەسانە بکات کە شارەزاییان دەربارەی کتێب هەیە ، کە کامە کتێب باشترین کتێبە لەو بوارەی کە تۆ حەزت پێیەتی .

3 پێداچوونەوە و ڕاکان :- پاش ئەوەی کە جۆری کتێبەکەت دەست نیشان کرد وە زانیت کامەی باشترین جۆری کتێبە لەم هەنگاوەدا دەست دەکەیت بە وەرگرتنی ڕای خەڵکی دەربارەی ئەو کتێبە ، دوای خوێندنەوەی کتێبەکە ڕایان لەسەر کتێبەکە چۆن بوە؟ ، گەشتوونەتە چ دەرئەنجامێك ؟

٤- پێرست :- پێویستە پێش ئەوەی هەر کتێبێك کە.بتەوێ بیکڕی یانبیخوێنیتەوە ئەوا سەرتا سەیری پێرستی کتێبەکە بکە ، چونکە لە پێرستی کتێبەکە ناوونیشانی هەموو سەرەبابەتەکانی کتێبەکەت پێ دەدات ، لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەکانی ، تا بزانی ئایا ئەو بابەتەی کە بەدوایی دەگەڕێیت لەو کتێبەدا هەیە یاخود بو و نی نیە ، چو نکە زۆر جار ناونیشانی کتێب جۆرێکە و بابەتەکانی نێو کتێبەکە جۆرێکی ترە .

٥- دیوی دواوەی کتێبەکە :- زۆر جار ئەو دەزگایەیی کە کتێبەکە بە چاپ دەگەینێت ، لە دواوەی کتێبەکە لەسەر بەرگەکەی هەندێك زانیاری دەنووسێت ، وەك کورتەیەك دەربارەی نووسەر ، یان کورتەیەك لە کتێبەکە یان ڕای زانایان دەربارەی کتێبەکەی ئەو ، یان چەند ووتەیەکی کاریگەر لە کتێبەکەدا ، بۆیە پێویستە سەیری دواوەی کتێبەکەش بکەیت بۆ بەدەست هێنانی زانیاری زیاتر دەربارەی کتێبەکە.

٦- خوێندنەوەی بەشی یەکەم :- هەوڵدە بە پێی توانات بەشی یەکەم لە کتێبەکە بخوێنیتەوە چونکە لە خوێندنەوەی بەشەی یەکەمی کتێبەکە هەم جۆری نووسینی نووسەر شارەزادەبیت ، هەمیش جۆری ئەو فۆنتەی کە تێیدا بەکار هاتوە تا چ ئاستێك بۆ چاوت گونجاوە ، زۆربەی نووسەرەکان هەوڵ دەدەن بەشی یەکەمی کتێبەکەیان بەهێز بێت تا سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیاندا ڕابکێشن بۆ بەردەوامی دان بە خوێندنەوەی کتێبەکە ، بۆیە ئەگەر لەبەشی یەکەم حەزت بۆ کتێبەکە درووست نەبوو ئەوا پێویست ناکات بەشەکانی تر بخوێنیتەوە .





ئەیاد نادر



# زانستی سەردەم پاڵپشتی لە قورئانی پیرۆز دەکات

لەسەر سەرەتای دروست بونی گەردون کەزانستی سەردەم پێی دەلێن تەقینەوەی گەورە کە لەخالێك دروست بووە وە لە قورئانی پیرۆز ئەفەرمووێ : ( ئایا بێباوران نابینن کە ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچەبوون دواتر بوون بە پارچەی جیاجیا تا ئەو ئاسمانانەو زەوی پێکهات (أولم یر الذین کفروا ان السماوات والارض کانتا رتقا ففتقناهما)الانبیاء ٣٠بەلام دواتر چی بەسەر گەردون دێت لای هەموو زاناکان گەردوون ڕۆژێك کۆتای پێدێت چونکە گەردون بەهۆی هێزە رەشەکە بەبەردەوام لەفراوان بوندایە کاتێك خوای گەورەش ئەم زانسەی پشت راست کردۆتەوە بەوەی دەفەرموێ: (والسماء بنیناها بأید وإنا لموسعون)الذاریات ٤٧ ( ئاسمانمان



دروست کردووە ئێمەش بەبەردەوام فراوانی دەکەین ) و زاناکان دەڵێن دوای ئەوەی کە ئاسمانەکان زۆر فراوان دەبن گەلە ئەستێرەکان لێکتر دوور ئەکەونەوە لێکترازان ڕوودەدات ئینجا بەو خێراییەی کەوا دروست بووە بەهەمان خێرایش لەناودەچێ بەسەر یەك دادەکەوێ خوای گەورەش ئەم دیاردەیەش وامان بۆ باسدەکات دەفەرموێ : ( یوم نطوي السماء کطي السجل للکتب کما بدأنا أول خلق نعیده وعدا علینا إنا کنا فاعلین)الأنبیاء ١٠٤( ڕۆژێك ئاسمان ئەپێچینەوە وەك لوولدانی پەرێکی نوسراو وەك چۆن سەرەتا دروستمان کرد هەروا دەی گێرینەوە ئەوە بەلێنە لەسەر خودایە خوای گەورەش بەتەئکید دلنیایی ئەوکارە ئەکات ) جالێرە زۆر بەوردی باس لەوەدەکات کە چۆن ئاسمان دروست بووە بەهەمان شێوەش لەناو دەچێت کەواتە بە چ هێزێك دروست ، ئێستا با بزانین چۆن خۆر لەناو دەچێت سەرەتا ئەستێرە پێکدێ لە گازی هایدرۆجین و هلیۆمی گرگرتوو وە کۆتایی هاتنی ئەستێرە لەسەرٚ قەبارەی بەندە ئەوانەی کەلە قەبارەی خۆردان کاتێك گازی هایدرۆجین دەگۆڕێ بۆ هلیۆم بەرەبەرە گەورە دەبێت تا قەبارەکەی ١٠٠ئەوەندەی ئێستای گەورەدەبێ لەوکاتە گەرمای روی کەم دەبێتەوە شلتریش ئەبێت رەنگی ئەگۆردرێ بۆ سور پێشی ئەوترێ geante rouge ئەستێرە گەورە سورەکە ئەمەش دوای ٥٠٠٠٠٠ سال وەزنەکەی نامێنێت دەبێتە نەوبەستی سپی ئەمەش دوای ملیاران سال ئەکوژێتەوە دەبێتە نەوبەستی رەش دوای ئەستێرە گەورەکان وەك پێشوتر لەناودەچن بەلام بەخێراتر وە هیلیۆمەکەی دەبێتە کاربۆن وەلە ناوەراستەکەی دەگۆڕدرێت بۆ ئاسن وەئەویش ئەگۆردرێ بۆ کانزای سوك ئەلیکترۆنەکان و برۆتۆنەکان یەکدەگرن نیترۆن دروست دەبێت بەخێرا دەتەقێتەوە بەسمان روناکیەکەی ملیاران جار زیاتر ئەبێ لەوەی هەیە جالێرە پێویست دەکات هەلوەستەك کورت بکەین لەسەر قورئانی پیرۆز بکەین بابزانین چۆن باسی ئەم مشهەدانەمان بۆدەکات ئەفەرمووێ : ( یوم تبدل الارض غیر الارض و السماوات ) ابراهیم ٤٨ واتا : ( ئەو رۆژەی کە زەوی دەگۆڕدرێت بۆزەویکی تر لەگەل ئاسمانەکانٚ ) دیارە بەهۆی گۆڕانی قەبارەو تیشکی خۆر گۆڕانکاری گەورە بەسەر زەوی و ئاسمان دادێت لە ئایەتێکی تر ئەفەرمووێ : ( فإذا برق البصر* وخسف القمر* وجمع الشمس والقمر ) القیامة ٧.٨.٩ واتا : ( لەوکاتەی لەگەل تیشکی روناکی چاوەکان لەکار ئەکەون وەدواتر مانگ لەناوئەچێت وەشێوازی لەناوچونی لەگەل خۆر یەکدەگرن ) ئەم ئایەتە بەرونی زانستمان بۆ شیدەکاتەوە کاتێك روناکای خۆر ملیاران جار زیاتربێ چۆن چاوەکان کوێرنابن کاتێك خۆر ١٠٠ ئەوەندەی خۆی بێت چون مانگ کێشناکات وەلەناوناچێت لەگەر گەرما و کێشکردنە بێوێنەکەی وەهەم ئەفەرمووێ : ( وتري الناس سکاري وما هم بسکاري ولکن عذاب الله شدید ) واتا : ( خەلك ئەبینن لەرۆژی زندوو بونەوە کەسەرخۆشن بەلام ئەوان سەرخۆش نین بەلام سزادانی خوای گەورە زۆر توندە ) لێرە یەك لە ئیعجازی گەورەی قورئانی بەدەر دەکەوێ ئەویش ئەوەیە کاتێك کە خۆر قەبارەکەی ١٠٠ ئەوەندەی خۆی لێدێت ئەوا هێزی کێشکردنی زیاد دەکات مانگ بەهۆی کەمی کێشەکەیەوە خۆر لەگەڵ خۆی دەدات وە زانایانی فەلەکی ئەلێن ئەوکات خۆر یەك میل نێوانی لەگەل زەوی ئەبێت بۆیە زەوی بەخێرایەکی بێوێنە بەدەوری خۆر ئەسورێتەوە بەهۆی خێرایەکەی ئەوەی لەسەر زەوی بێت توشی سەرسوران ئەبێت تائەندازەیەك هەمووان وەك سەرخۆشیان لێدێت بەهۆی ئەم خێرا سورانەوەی زەوی چیاکانیش لەناو دەچێت وەئەم وێنەیەش خوای گەرە ئەفەرمووێ : ( وإذا الجبال سیرت ) واتا : (ئێوە ئەبینن کە کێوەکان بەئاسمان بلاو ئەبنەوە و لەناودەچن ) ( وقل الحمد لله سیریکم ءایاته فتعرفونها وما ربك بغافل عما تعملون ) واتا ( ئێوە بلێن سوپاس بۆ خوای گەورە نیشانەو بەلگەکانتان نیشان دەدات ئێوەش دەیناسنەوە پەروەردگاری تۆش بێئاگا نییە لەو کردەوانە کەئەنجامی دەدەن )

ئاوارە کاوێس

# وەرە سەر کەشتی ڕۆحانی کە نوێژە

من دەمەوێت لەبارەی ئەوخەڵاتەوە بدوێم بۆخۆم سەرەتا چونکە مرۆڤ پێوستی بە هەڵوێستێ هەیە لەژیانیا ئینجا سودێك بگەیەنم (نوێژ) ئەوپەیوەندیە ڕۆحیە یە لەنێوان مرۆڤ و خودای میهرەبان ئەوەی بزانێ بەرامبەرکێ ڕاوەستاوە کارێك دەکات لێی ڕازی بێت ، ئەزیزکانم کەنوێژ ئەکەن پێش نیەت دڵت بسپێرە بەپەروەرێنت لەحکمەتەکەی بگەن واگومان بکەن هەموو ووشەکانی کوردین دەبێ لێی تێبگەن گەر وەکو تەمرینێك ئەیکەن یەك ڕۆژ بچنە لای مامۆستای تەمرین کەپێتان ئەڵێت تەمرین بەپەلە هیچ سـودێکت پێ ناگەیەنێت ئەمە تەمرین ، دەی نوێژ پڕە لە هونەر من ناتوانم چێژی نوێژت پێ بڵێم تاخۆت نەیچێژی ، ئەزیزانم نوێژ لە هەمووشتێ نزیك ترە لە ڕەوشتەوە، بەهێمنی ئەنجامی بدە چ شتێ لە نوێژ گرنگترە؟ خێرا لە کڕنوش و سجود مەبەرەوە سکی دەستت لەزەووی بچەسپێنە داوای خشوع بکە لە سوجدەدا، من لێرەوە بە دڵنیاییەوە ئەڵێم داوای هەرچی بکەی خودای میهرەبان دەیبەخشێ پێت بەمەرجێ دڵنیابیت کە خودا گیان بینەر و بیسەرە،خۆشەویستانم بەدوور بن لە ڕیای با نوێژەکانمان خۆشەوستمان بن لێی وورد بەرەوە بچۆرە ناخیەوە هەست بکە تۆ گوڵیت نوێژە کەت ئاوە بزانە چەندت پێوستە، وەکو بۆنخۆشی دڵان دروودی خوای لەسەر بێت ئەفەرمووێ: ( نوێژەکانتان ئاگاتان لەنوێژەکانتان بێ ) دڵتان باپەوەست بێ بەو خەڵاتە خواییەوە کە لەشەوی ئیسراو معراجدا بە تەواوەتی فەڕزکراوە هەموو ئەمانەی باسم کرد بێ نوێژی بەیانی کەموو کورتی تێدایە.



**باخان ئەنوەر محمد**



# پێناسەی
# عەشق
## لە دیدی ڕۆمییەوە (مەسنەوی مەعنەوی بە نمونە)



پێدەچێ پێناسەی عەشق لە هەرە ئەو بابەتە لەپێشانە بێت کە ساڵەهای ساڵە مشتومڕی لەبارەوە کرابێت. لە بنەڕەتا (عەشق) وشەیەکی عەڕەبییە و بە مانای پێوەلکان و پێوەنوسان دێت. لە زمانی عەڕەبی بە لاو لاو دەڵێن عشق . لاولاو بەرز دەبێتەوە و بە دار و دیواری تەنیشتیەوە دەئاڵێ خۆی بەوان هەڵدەواسێ تا وشك دەبێ ئەوە لە ڕووی زمانەوە بوو بەڵام وشەی عەشق وەك چەمك و دەستەواژەیەکی عیرفانی مانایەکی زۆر جیاوازی هەیە. لێزانانی پێشین تاکو سەردەمی مەولانای ڕۆمی زۆریان ڕاڤە نوسیوە بەڵام تاکو ئێستاش یەکڕایی لە پێناسەی عەشق نەهاتۆتە ئاراوە. مەولانا هەوڵێکی باشی لەم بوارە داوە بەڵام وەکو خۆی دەڵێت نەگەیشتۆتە ئەنجام وەکو دەفەرموێت:

هرچه گویم عشق را شـــرح و بیـــان
چون به عشق ئێیم، خجل باشم از ین
گـرچـه تـفـسیر زبان روشنگر است
لیـــك عشق بی زبان روشن تر است
چـون قلـم اندر نوشتن می شتافت
چـــون به عشق یمدم، قلم بر خود شکافت
عقل، در شرحش چو خر در گل بخفت
شرح عشق و عاشقی هم عشق گفت
(دفتر اول112,115)

واتە: هەرچی لەبارەی عیشقەوە ڕوونکردنەوە و ڕاڤە بڵێم وەختایەکی کە دەگەمە عەشق شەرمەزار دەبم و زمانم دەبەسترێ. خۆ ڕاستە زمان دەتوانێ هەموو شتێك بڵێت و تەفسیری هەموو شتێك بکات بەڵام کە باس دێتە سەر عەشق واباشە زمان هیچ نەڵێت چونکە تاریفی عەشق بە زمان ناکرێ. هەرچەندە قەڵەم لە نوسینێ پڕتاو بێ بەڵام کاتێ دەگاتە وشەی عەشق ئیدی خۆی ناگرێ و لەتوکوت دەبێ. نەك هەر زمان و قەڵەم بەڵکو عەقڵیش لە باس و خواسی عەشق کەودەنییە و وەکو کەری ناو خۆڵ و تۆزێیە، ئاخر پێناسە و ڕاڤەی عەشق هەر بە عەشق دەکرێ. لێرەوە گەیشتینە ئەو خاڵەی کە بەڵێ مەولاناش وەکو زانا و دڵدارانی پێشووی خۆی زیرەکانە خۆی لە پێناسەی عەشق بەدوورگرتوە هەروەکو فەرموویەتی:

شرح عشق ار من بگویم بر دوام
صد قیامت بگژرد ، و ئێن ناتمام

واتە: ئەگەر من بە بەردەوامی لە باسی عەشقەوە بدوێم هەتا سەد قیامەتیش دێت ، هێشتا باسی عەشق ناتەواوە و پایانی نایێ. مەسنەوی کۆتایی دێ بەڵام پێناسەی عەشق بەرچاو ناکەوێ و مەولانا کە سوڵتانی عاشقان بوو نەیتوانیوە تاریفێکی تەواو و پوختی عەشق بکات.



نیاز عەزیز (مەستی)

# هەندێك لە ئامۆژگاریەكانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەربارەی خواردن و خواردنەوە



یەكەم : لەقاپی شكاودا خواردن و ئاو مەخۆن و مەخۆنەوە : نهي رسول الله (درودی خوای لەسەربێ)عن الشرب من ثلمة القدح ، رواه الترمذي.واتا:پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رێگەی نەداوە بەئاو خواردنەوە لە قاًپی شكاودا .

دووەم : خواردن بەگەرمی مەخۆن . إن النبي (درودی خوای لەسەربێ) كان لايأكل الحار ويقول إنه غير ذي بركة وإن الله لم يطعمنا نارا واتا: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) خواردنی بەگەرمی نەدەخوارد و بەڵكو ساردی دەكردەوەو ئەیفەرموو بەگەرمی زیانی هەیە و خوا ئاگری نەكردوە بەخۆراك .

سێیەم : لەدوای نان خواردن یەكسەر مەخەوە . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : أكل العشاء والنوم عليه قسوة في القلب .رواه الديلميواتا خواردنی ئێوارەو خەوتن بەسەریدا دڵ ڕەش دەكات (زیانی هەیە).

چوارەم : لە كون و لولەی ئاو مەخۆنەوە . نهي رسول الله (درودی خوای لەسەربێ) عن الشرب من فئ السقاء .واتا:پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) قەدەغەی كردوە خواردنەوە لە دەمی قاپێكەوە كەناوەكەی دیار نەبێت.



پێنجەم : ئەگەر شتێكت خوارد تام و شیلەو چەوری هەبوو ئاو لەدەمت وەردە .پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : إن رسول الله (درودی خوای لەسەربێ) إذا شرب لبنا فدعا بماء فتمضمض وقال:إن له دسما .واتا:كاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) شیری دەخوارد داوای ئاوی دەكرد و لەدەمی وەردەدا و دەیفەرموو چەوری تیایە (مانەوەی لە دەمدا زیانی هەیە).

شەشەم : بەبرسیەتی مەخەوە . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : لاتدع العشاء ولو بكف من التمر، فإن تركه مهرمة . واتا:بێ شێو مەخەوە ئەگەر لەتە خورمایەكیشت خواردبێ وازلێ هێنانی زوو پیری دەهێنێت .

حەفتەم : پێش دەست پێكردنی نان خواردن و دوای تەواو بوونیش لە خواردن دەست و دەمت بشۆ . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : من أحب أن يكثر الله بيته فليتوضأ إذا حضر غداؤه وأذا رفع. واتا:ئەگەر كەسێك دەیەوێت خوا ماڵەكەی پڕ بكات لە خێر بادەست و دەمی بشوات پێش خواردن و دوای خواردن .

هەشتەم : كەخواردنت هەڵگرت سەری داپۆشە . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : غطوا الإناء وأوكوا السقاء..... رواه مسلم. واتا:سەری دەفری خۆراك داپۆشن ودەمی قاپی ئاو بگرن.

نۆیەم : خواردن پێش بخە بەسەر نوێژكردندا كاتێ هەردووكیان ئامادەبوون. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : اذا وضع العشاء وأقيمت الصلاة فأبدؤوا بالعشاء، رواه البخاري. واتا:كاتێ خۆراك و نوێژ ئامادە بوو دەست بكەن بە خواردن.

دەیەم : تا بۆت دەكرێت بەدەستی ڕاست خواردن بخۆ . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : إذا أكل أحدكم فليأكل بيمينه وإذا شرب فليشرب بيمينه.. رواه احمد و مسلم و ابوداود. واتا:هەریەك لەئێوە خۆراكی خوارد با بەدەستی ڕاست بیخوات و ئاویشی خواردەوە با هەر بەدەستی ڕاست بیخواتەوە .

یازدەیەم : خواردن خواردنەوە لە قاپی زێر و زیوو مەخۆن . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : ولاتشرب في آنية الذهب والفضة...، رواه البخاري. واتا: بۆ خواردن و خواردنەوە قاپی ئاڵتون و زیو بەكار مەهێنن .

دوازدەیەم : بە ناوی خودا دەست بە خواردن خواردنەوە بكەن . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : إذا أكل أحدكم طعاما فليذكر إسم الله.فإن نسي أن يذكر إسم الله في أوله فليقل (بسم الله أوله وآخره) ، رواه ابو داود و الترمذي. واتا:لەكاتێكدا دەست كردن بەنان خواردن ناوی خوا بهێنە بڵێ (بسم الله) ئەگەر لە بیرت چوو لەسەرەتاوە ، هەركات بیرت هاتەوە بڵێ(بسم الله أوله وێخره)

سێزدەیەم : سوپاس كردنی خودای گەورە دوای خواردن و خواردنەوە . پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت : إن الله ليرضي عن العبد أن يأكل الأكلة فيحمده عليها أويشرب الشربة فيحمده عليها ، رواه مسلم و احمد . واتا:پەروەردگار ڕازی دەبێت لەو بەندەیەی كەخۆراك دەخوات و سوپاسی خوای لەسەر دەكات و كەئاویش دەخواتەوە هەروا سوپاسی دەكات .



# ئەورۆ سینگ فراوانی و ئارامگرتن مەتەلەبە بەهای (ألقیم) خۆشەویستی نەخشە ڕێگای ژیانە



پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و تەقنیاتی سەردەم و جیهانگەرایی و بچووك بوونەوە دونیا ژیانێکی بێ ڕۆح و بێ تامی پێمان بەخشیوە کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دونیا خەریکی کۆکردنەوەی سامانی دونیان سیمەی ئەو چەرخە ناسراوە بە بازرگانی جیهانی و دیموکراسی ئابووری دیاردەیەکیتری جیهانی ئەمرۆ پێدا گوزەر دەکات هەژار بوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە بە هۆی سەرپەرشتی کردنی راستەوخۆی ئەو هەموو تەشریعاتە ئابوورییانەی کە بەشێکە لە جیهانگەرایی ڕۆژئاوا وەك ( بانکی نێودەوڵەتی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بازرگانی نێودەوڵەتی) جگە لەوانەش جیهانگەرایی مەترسییەکیتری لەگەڵ خۆی ڕاپێچ کردووە بۆمان ئەویش دڵەڕاوکێ وترس و تۆقاندن و توندڕەوییە کەسانێك هەن لە ناو نیشتمانەکەیاندا جیهانگەرایی پەروەردەی کردوون ئامادەن نیشتمانەکەیان وێران بکەن و ئالیەتی ئەوەشی بۆ دەستەبەر کردوون. جیهانگەراییە کە 'بەها' کانی کاڵ کردۆتەوە و لاوازی کردوون، لەوانەش بەهای ئەخلاقی و ڕۆحی و دادپەروەری و خۆشەویستی... کە بڕبڕەی پشتی مرۆڤایەتی پێ وەستاندووە، ئەمرۆ بیرمەندان و حەکیمان و زاناکان هاوڕایانە بۆ ئەوەی ئەو بەهایانە لە تەك سفرەی نان خواردن دابنرێن و بەردەوام ئاو رشێن بکرێن و نەمانی ئەو بەهایانە گەشەی پێ بدرێتەوە، وە ڕێگا چارە بۆ نۆژەن کردنەوەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی تۆخکردنەوە و گرنگیدانە بە بەهاکان. کاتی هاتووە بۆ ئەنجامدانی هاوپەیمانیەتێکی نوێی جیهانی و ئیقلیمی بۆ گەشەی بەها هاوبەشەکان وەك ئاشتەوایی و ڕاستگۆیی و دادپەروەری و پیاوەتی (الْفچیله)... هتد تاکو متمانە و دۆستایەتی و پێکەوە ژیان و لێبوردەیی و یەکتر قبوڵکردن چیتر هەڵنەخلیسکێ، نموونەیەکی زیندوو دێنمەوە کە سنوری نێوان ئەمریکا و کەنەدا هەزاران کیلۆمەترە و یەك سەرباز چاودێری ناکات چونکە بەهای هاوبەش و (مسل العلیا) لە نێوانیاندا هەیە. هربرت مارکوز دەڵێ مرۆڤایەتی تووشی قەیرانی ون بوونی زاتی خۆی بوە لە هەموو رۆڵە سیاسی و ئەخلاقی و بەهاکانی تر دایشۆراندووە بۆ خزمەتی ئەوەندەم هەیە و ئەوەندەم بەش دەکات کانت دەڵێ: ئاشتەوایی بەرزترین بەهایە و مەرجە بۆ بەدیهێنانی سەرجەم داخوازییەکانی تر لە ئازادی و سەربەخۆیی و ماف و خۆشگوزەرانی نایەتە دی بێ بەهای ئاشتەوایی. ئەوەی ویستم من لێرەوە ئاماژەی پێ بدەم کە لەو ماڵوێرانی و کوشتن و بڕین و پاکتاوی ڕەگەزی و مەزهەبی و تیرەیی هۆکارەکەی ناهۆشیاری بەهای جیاوازییە لە بیروبۆچون و بیرکردنەوەمان. ئەرکی کێیە پەروەردەمان بکات؟ بۆ ڕاهێنانمان و باس کردنی ئەو بەهایە مەزنە بۆ ناو ناخ و هەست و ویژدانمان تاکو چیتر ئەزیەتی یەکتر نەدەین و بە تەبایی و شیر حەلالی مەجدی باب و باپیرانمان بگەرێنینەوە ناو چوار گۆشەی خۆی کەواتە هاوپەیمانیەتی بەهاکان وەزیفەیەکی نوێیە دەبێ بیرمەندان کاری تێدا بکەن وە بەهای جیاوازی بیرکردنەوە گەشەی پێ بدرێت کە بە ڕوکنی سەرەکی بنبڕ کردنی توند و تیژی و توندڕەوی دادەنرێت، کوردیش لە هەموو نەتەوەکانی تر چاوی لە دەستی حەکیم و زانا و بیرمەندەکانیەتی بۆ سارێژ کردنی برینە قوڵەکەی ناو دڵیەتی، ئەورۆ دیاردەی درۆ و بوختان و ڕق لێ بوونەوە و وەلانانی شوێنی خۆشەویستی و برایەتی گرتیتەوە و هەر بۆیەش پێغەمبەری مەزنمان دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت (لا یؤمن أحدکم حتی یحب لأخیە ما یحب لنفسە) ئەو خۆشەویستیە برایەتی موسلمانی و برایەتی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە بەوەش خۆشەویستییەکەی بۆتە نەخشە ڕێگای ژیان کەواتە چەتری بەهاکان تاکە پەسارگەیە بۆ پاراستنمان



حاجی سلام کریم سیدان



# خوای گەورە چ پێویستیەکی بە بەندایەتی ئێمە هەیە کە داکۆکی لەسەر دەکات و دەفەرمویێت : ( خواپەرستی بکەن )؟



پەروەردگار نەك عیبادەتەکەی تۆ، بەڵکو ئاتاجی هیچ شتێك نیە، ئەوە تۆیت کە پێویستت بە عیبادەتە و لەڕووی دەروونیەوە نەخۆشیت، عیبادەتیش لەحوکمی چارەسازی زامە مەعنەوییەکاندایە، داخۆ ئەگەر نەخۆشێك دەربارەی ئەو نەخۆشییەی کە گرفتاریەتی، پزیشکێکی بەبەزەیی و دڵسۆز دەرمانی بەسوودی بۆ بنوسێت و سووربێت لەسەر پێدانی ئەو دەرمانە و نەخۆشەکەش لەبەرامبەر ئەم پێداگرییەی پزیشکەکەدا بڵێت: ( تۆ چ پێویستییەکت بەوە هەیە کە ئاوا سووریت لەسەری؛ تێدەگەیت کە چەندە بێمانایە. ئینجا خوای گەورە هەروەك بە لوتف و گەورەیی خۆی ئەم گەردوونەی کردووە بە خزمەتکاری ئێمە، هەرواش بە لوتف و میهری خۆی فەرمانی بەندەگی و گوێڕایەلیمان پێدەکات، هەتاوەکو بەوانە بگەینە بەختەوەری هەتا هەتایی، هەروەك چۆن خوای گەورە هیچ پێویستی بە پەرستشی ئێمە نییە و بێ نیازە لە بەدیهێنراوانی، ئاواش یاخیبوونی بەندەکانی هیچ زیانێك بەو ناگەیەنێت، لەهەردوو بارەکەدا مەسەلەکە تەنها بەرژەوەندی مرۆڤە. ئیدی فەرماندان بە بەجێهێنانی پەرستشەکان هەزارەها سوود و قازانجی بۆ ئادەمیزاد تێدایە. کەسێك کە عیبادەتەکانی بەرێکوپێکی بەئەنجام دەگەیەنێت، بە ژیانێکی زۆر رێکوپێك شاد دەبێت و لەدونیاشدا ئاسودە دەبێت و لە ئامانج و مەبەستی دروستبوونی خۆی و گەردوون تێدەگات و ژیانێکی پڕ ئامانج و هەتاهەتایی دەسدەکەوێت، مەگەر بۆ مرۆڤ سەرمایەیەکی دی هەیە کە هێندەی پەرستش و بەندەگی سوودمەند بێت بۆی؟

سەرچاوە:

(کتێبی تیشکەکان – مامۆستا سەعیدی نووڕسی کوردی)



لێزمە وەصفی



# مەلا و دڵداری ؟



ئەوەی شارەزاییەکی کەمی لەئەدەبی کوردی هەبێت و چاوێکی خشاندبێت بە دیوانی یەك دوو شاعیری کلاسیکی کورد، کە ژیانی شاعیران دەخوێنێتەوە دەبینێت کە ئەگەر هەمووشیان نەبن، زۆربەی زۆریان "مەلا" بوینە و زایندەی بیر و فکرە پاکەکەی حوجرە بوون، حوجرە هەوێنی هەستە ناسکەکەیان بوو، مەلای دوازدە عیلم بوون، لەگەڵ ئەو پلە و پایە ئاینییەی هەشیانبوو، لایەنی دڵداری بەشێکی زۆری دیوانەکانی گرتووە و فەرامۆشیان نەکردووە، بەڵکو شاعیری واهەیە کە زیاترینی شیعرەکانی شیعری دڵدارین، باشە ئەو مەلایەتیەی کە هەیانبووە چۆن لەگەڵ ئەو دڵداریە دەگونجێ کە لەدیوانەکانیان هەیە ؟، مەلا و دڵداری؟. مەبەستی دڵداری یەکێکە لە مەبەستە سەرەکیەکانی شیعری کلاسیکی کوردی و بەهیچ شێوەیەك لێك جودا ناکرێنەوە، بەڵام ئەو دڵدارییە تەواو بەرجەستە بوە لە ژیانییان ؟ ئایا کۆمەڵگەی کوردەواری ئەوەندەی ڕێگەی بە ژن داوە کە بەئارەزووی خۆی بێتە دەرەوە و شاعیریش شیعری بەسەردا بڵێ ؟ بێ گومان وەڵامی ئەو پرسیاری دووەم دەبێ نەخێر بێ و کۆمەڵگای کوردی قەت وانەبووە، بەڵکوو دایکانمان دەگێڕنەوە کە تا ماوەیەکی زوو لەمەوبەر ئافرەتانمان بە ( پێچە) هات و چۆیان دەکرد، باشە کە ئافرەتان بە پێچە بوون و داپۆشراو بوون، چۆن شاعیر توانی پەرچەمی ببینێت و دیقەتی بداتێ و بەشیعر وەسفی بکات ؟ هەرچی وەڵامی پرسیاری یەکەمە کە بەرجەستە بوونی لایەنی ماددی خۆشەویستی و دڵداریە لە ژیانی شاعیرانی کورد دا، ئەوا ئێمە دەبێ دان بەوە دابنێن کە بەشێکی ئەو شیعرانە لایەنی بەرجەستەییان هەیە و دڵداری دەنوێنن بۆ ( ژن ) بەڵام لایەنی دیکەشی هەیە لەوانە کە زۆر جار شاعیر شیعری دڵداری بەسەر خێزانەکەی نووسیوە و بەجوانترین شێوە وەسفی کردووە ، هەروەك لێکدانەوە بۆ ( حەبیبە) ی ناڵی دەکرێ کە حەبیبە خێزانی ناڵی بوبێ(1)، یان هەندێك لەو شیعرانە لایەنی تەسەووف و خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر دەردەبڕن و کەسی سادە بە خوێندەنەوەیەکی سەرپێیی تێیان ناگات . لایەنێکی گرنگی تر لەبارەی ئەوەی کە شاعیرێکی دیندار و خواناس چۆن شیعری دڵداری نوسیوە و ژنی وەسف کردووە ئەوەیە کە: مەبەستی دڵداری لە شیعردا مەبەستێکی باوە و ئاستی شاعیری پێ دیاری دەکرێ، لەو ڕوانگەیەوە شاعیر بۆ خۆناساندنی وەك شاعیرێکی پایەبەرز ئەو شیعرانەی نووسیوە، خۆ دەرخستنیش وەك شاعیر کارێك بوە کە لە واقیعدا هەبوە، و لەوانەیە ئەگەر شاعیرێك شیعری دڵداری نەبوبا بە شاعیرێکی بێ هێز لەقەڵەم درابا(2) .

لەوانەیە شاعیر لەشیعرەکانیدا مەبەستێکی سۆفیزمانەی هەبێت کە بەناوی (عیشقی حەقیقی) ناوزەند دەکرێت، کە ئەو مەبەستە لەوانەیە ئەوەندە تۆخ بێت کەلەلای ئەو شاعیرانە بە( موتڵەق) ناوببرێت کە باسی پەیوەندی نێوان کردگار و درووستکراوە(3). ئەگەر ئێمە ئەو جۆر لێکدانەوانە نەکەین ئەوا دەبێت شاعیرانمان بە (ئیزدیواجی) لەقەڵەم بدەین، کە ئەمەش دوورە لە شاعیرانمان و لە ئاست پلە و پایەیان دانییە، چونکە ناکرێ مرۆڤ بەمزگەوت و حوجرە و فەقێ و خواپەرستنەوە پابەند بێت و لەهەمان کاتیشدا چاوی لە خۆشەویستی و دڵداری بێت، ئەوە دووە پێکەوە کۆبوونەوەیان زەحمەتە(4).

سەرچاوەکان:

1.هەروەك ماموستا عبدالکریمی مودەڕریس و ماموستا فاتح عبدالکریم مودەڕریس وادڵێن و هەر ئەو لێکدانەوەشیان لە: کوردی و مەریوانی و ئەمین زەکی بەگیش گواستۆتەوە. بڕوانە: پێشەکی دیوانی ناڵی، لێکدانەوەی: ماموستا عبدالکریمی مودەڕریس و فاتح عبدالکریم، لا: 22، دەزگای پەخشی چوار چرا، چاپی یەکەم، 2708کوردی .

2.بڕوانە: پێشەکی دیوانی پاکی، کە پێشەکیەکە لەلایەن دکتۆر ئیبراهیم تاهیر مەعروفەوە نوسراوە، لا: 35 – 36، تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن، چاپی یەکەم 2007 ز .

3.بڕوانە: مێژووی ئەدەبی کوردی، دکتۆر مارف خەزنەدار، 1/196، دەزگای ئاراس، هەولێر، چاپی دووەم، 2010ز .

4.بڕوانە: پێشەکی دیوانی پاکی، لا: 36 .



محمد ملا سعدالدین

# بیروبۆچونە جیاوازەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی و چەند ڕاستیەك



تەریقەتە سۆفی گەرییەکان شوێنێکی دیارو ناوازەیان هەبوە لەناو دەوڵەتی عوسمانی، سەرەتای دەرکەوتن و چالاکیان لەناوچە تورك نشینەکان لەسەردەمی سەلجوقیەکان لەسەدەی 13زاینی بوەو کۆتاییەکەیان لە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی تا ڕوخانی دەوڵەتەکە بووە، بەشداریەکی کارایان هەبوە لەجەنگەکانی دەوڵەت لەگەڵ بێ باوەڕان و لە بڵاوکردنەوی ئاینی ئیسلام لەناو ئەو دەوڵەتە ئەوروپیانەی کە دەوڵەتی عوسمانی ڕزگاری دەکردن ئەمەش لەڕێگای تەکیەو خانەقایەکان بووە. لەبەرامبەردا دوو بزوتنەوەی سەلەفیەت لەکاتی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانی سەری هەڵدا کەیەکەمیان بزوتنەوەی قازی زادەیەو ئەوی تریان بزوتنەوەی وەهابیەتە کە دوور نیە ئەوەی دووەمیان لەژێر کاریگەری بزوتنەوەی یەکەمدا دروست بوبێت واتە بزوتنەوەی قازی زادە کەلای زۆربەی خەڵك نەناسراوە، کورتکراوەی تەواوی کارەکانیان خۆی دەبینیەوە لە (کافرکردنی خەڵك، قەدەغەکردنی قاوە و جگەرە، دژایەتی کردنی ڕێبازە تەصەوفیەکان). لەناو دەوڵەتی سۆفی گەری عوسمانیدا لەسەدەی حەڤدەی زایینی دا بزوتنەوەیەکی سەلەفیەت لەپایتەختی دەوڵەتی عوسمانی سەری هەڵدا، بانگەشەی پاکردنەوەی دینی دەکرد لەبیدعە وەگەڕانەی ئیسلام بۆ ڕێچکەی خۆی، ئەم بزوتنەوەیە بە بزوتنەوەی قازی زادەو شوێنەکەوتوانی ناسراوە، کە دژایەتیەکی تەواوی ئەهلی تەصەوفیان دەکرد هەر لەسەرەتاوە.

قازی زادە: قازی زادە ناوی موحەممەدە لەساڵی 1582ز لەدایك بووە، پاش تەواو کردنی وانەئاینیەکان بەوتاربێژ لەیەکێك لە مزگەوتەکانی ئەستەمبۆڵ دامەزراوە، پاشان بووەتە سۆفی تەریقەتی خەلوەتی و لەخزمەت شێخ عومەر ناوێك کە شێخی ئەو تەریقەتە بوە چۆکی داداوە، پاشان لێیان هەڵگەڕاوەتەوەو بەتوندترین شێوە و بەهەمو شێوازێك لەدژیان وەستاوەتەوە. لەبانگەوازەکەی دا چەندەها وتاربێژی مزگەوتەکەان شوێنی کەوتن، دژی بیدعەو بیدعەکاری دەدوان و چالاکیان دەنواند، هەروەها دژی قاوە خواردنەوەو جگەرە کێشان بوون کە تازە پەیداببون لەناو دەوڵەتی عوسمانی، - قاوەخواردنەوە لەساڵی 1555ز هاتبوە ناو دەوڵەتی عوسمانی - ، دژی بازنەی زیکری سۆفیەکان و زیکری دەروێشان دەوەستان. قازی زادە بەهۆی بەتوانای لە وتاردان و کاریگەری لەسەر خەڵك لەلایەن دەوڵەتەوە کرا بەوتاربێژ لە مزگەوتی سوڵتان سەلیمی یەکەم پاشان کرا وتاربێژی مزگەوتی سوڵتان بایەزید، پاشان مزگەوتی سولەیمانیە، وەدواتر مزگەوتی ئایا صۆفیا، لەوتارەکانی دا قازی زادە بەتوندی هێرشی دەکردە سەر ڕێبازە سۆفی گەرییەکان بەتایبەت تەریقەتی خەلوەتی وەداوای لەشوێن کەوتەکانی دەکرد دژی سۆفیەکان بوەستن بەهەموو شێوەیەك وە ڕێگە نەدەن بازنەی زیکر لەناو مزگەوت ببەستن و هەڕەشەیان لێبکەن تا واز لەسۆفیەتی بێنن، وەخۆشی لەگەڵ یەکێك لە زانایە سۆفیە فەرمودەناسەکان بەناو عبدالمجید محرم سیواسی کەوتبوە ململانێ و کتێب نوسین لەدژی، عبدالمجیدە فەندی لەساڵی 1639 کۆچی دوایی کردووە، لەسەردەمی سوڵتان مورادی چوارەم چالاکی ئەم بزوتنەوەیە گەیشتە چلەپۆپە بەهۆی ئەوەی سوڵتان تارادەیەك پشتگیری دەکردن، لەژێر کاریگەری داوای وان سوڵتان بڕیای قەدەغەکردنی جگەرەکێشان قاوەخواردنەوەی دەکرد، وەهەرکەسێك سەرپێچی بکات



لەسێدارەی دەدەت!! هەر بۆیە زیاتر لە 15 کەسی لەسوپا لەسێدارەدا بەهۆی ئەوەی لەکاتی چونیان بۆ غەزای بەغداو ڕزگارکردنی لەدەست سەفەویەکان جگەرەیان کێشاوە، بێگومان ئەو سزایە بێ ڕەحمانە لەژێر کاریگەری داواکاری بزوتنەوەی قازی زادە بووە. قازی زادە لەساڵی 1635 کۆچی دوایی کردو وەك شوێن گرەوەی موحەممەد ئەفەندی ناوێکیان لەشوێن دانا کە بەئوستوانی ناسراوبوو. ئوستوانی: ئوستوانی کەبەفەرمانڕەوای وتاربێژان ناسراوە لەلایەن شوێنکەوتوانی لەساڵی 1608 لە دیمەشق لەدایك بوە، هەر لەوێش خوێندنە سەرەتاییەکانی خوێندووەو دواتر لە زانکۆی ئەزهەر کۆتایی بەخوێندن هێناوە، دواتر گەشتی کردوە بۆ ئەستەمبۆڵ و لەوێ ماوەتەوە، توانیویەتی کاریگەری لەسەر سوڵتانی عوسمانی دروست بکات، ئەم کاریگەریەی خۆی قۆزتەوە تا هێرش بکاتە سەر تەریقەتە سۆفی گەرییەکان و زاناکانیان، لەیەکێك لە وتارەکانی شیخ الاسلامی ئەوکاتی بەکافر دانا کە زانایەکی سۆفی بوو و ناوی زکریا یحیی ئەفەندی بوو، بەهۆی ئەو کاریگەریەی ئوستوانی لەسەر کاربەدەستانی دروست کردبوو دەوڵەت لەژێر کاریگەری ئەو لەساڵی 1651 تەکیەو خانەقای خەلوەتیەکانی ڕوخاندو شوێنکەوتوانی بزوتنەوەکە هێرشیان کردە سەر ئەو سۆفیانەی کەلەناو خانەقابوون. لەساڵی 1656 شوێن کەوتوانی بزوتنەوەکە لەسەر مینبەر داوایان لەخەڵك کرد کەچەك هەڵبگرن و هێرش بکەنە سەر سۆفیەکان، بۆیە حکومەت ئستوانی لەئەستەمبۆڵ دورخستەوەو لەساڵی 1661 کۆچی دوایی کردو محمد ئەفەندی وانی لەشوێنی دانرا. وانی: محمد ئەفەندی وانی لەگەڵ صدر الاعڤم دۆستاتی بەهێزبوو لەزۆر کار ڕاوێژی پێدەکرد، وەبانگی کرد بۆ کۆشکی سوڵتان تا یەکتر بناسن کە ئەوکات سوڵتان محمدی چوارەم لەسەر تەختی سەڵتەنەت بوو، ئەم سەرکردەیەش وەك سەرکردەکانی تر درێغی نەکرد لەهێرش کردنە سەر تەریقەتە سۆفی گەرییەکان ڕوخاندنی تەکیەو خانەقایەکان، هەر زوو ڕەزامەندی وەرگرت لە صدر الاعڤم و تەکیەی بیشکاتیشەکانی ڕوخاند لەنزیك شاری ئەدرنە و سۆفیەکانی لێ دەرکرد. لەساڵی 1670 قاوەخانەکانی داخست، زیکری بەجولەی سوفیەکانیشی بەتەواوی قەدەغە کرد. لەساڵی 1683 وانی هانی سوڵتانی دا بۆ جیهاد کردن و ئابلوقەدانی شورەی ڤیەننا بەبێ وەی دەوڵەت ئازوقەی جەنگی هەبێت و ئامادەی ئەو جەنگە بێت، بۆیە زۆر بەخراپی لەوشەڕەدا دەوڵەتی عوسمانی شکا، ئەم شکانە بوە هۆی دڵ هێشانی سوڵتان لە محمد وانی، بۆیە وانی دورخراوە لە ئەستەمبۆڵ و بەو شێوەیە تاڕادەیەك کۆتایی بەچالاکیە بێ بەرهەم و لاوازەکانی ئەو بزوتنەوەیە هات، بەڵام سەرکێشیەکانیان ناوە ناوە لێرەو لەوێ دوبارە دەبۆوە. لەساڵی 1692 پاش 8 ساڵ بەسەر کۆچی دوایی محمد وانیدا هەندێك لەشوێن کەوتوانی بزوتنەوەکە هێرشیان کردە سەر مزگەوتی بۆرصەی گەورەی سۆفیەکان لەیەك لەشەوانی قەدری مانگی رەمەزان تەنیا هۆکاریش ئەوەبوو کە سۆفیەکان نوێژی تەڕاویحیان 20 ڕەکعەت دەکرد و ئەوان پێیان وابوو کە تەنیا هەشت ڕەکعەتە، بەچەك هێرشیان کردنە سەرو و دوو کەسیان لێ شەهید کردن کە یەکێکیان پێشنوێژەکە بوو.

کانگاکان: هدیە العارفین/ أسماعیل باشا بابانی: 1 / 620 عیمانیون وسلفیون/ کریم عبدالمجید سلگان سلیمان القانونی/ یاوز بهادر أوغلو، تعریب: مصگفی حمزە: 414

عبدالله مەلا طاهر بحرکەیی



مەرجەکانی بڵاو بوونەوەی بابەت لەم گۆڤارە:

-1 بابەتکە نوێ بێ و لە شوێنی دیکە بڵاونەبووبێتەوە.

-2 بابەتەکان لە 2000 وشە تێنەپەڕن، گۆڤار بۆی هەیە بابەتی درێژ کورت بکاتەوە.

-3 ئەو نووسەرەی کە یەکەم جارە بابەت دەنێرێ، باشترە چەند دێڕێك لە ژیاننامەی خۆی بنێرێ.

-4 هەموو بابەتەکان دەکەونە بەر دیدی دەستەی نووسەران و ئەگەر لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی گۆڤار نەگونجان، بۆی هەیە رەتی بکاتەوە، یان داوا لە نووسەر بکا کە دەستکاری بکا.

-5 گۆڤار ئەگەر بابەتێکێکی قەبووڵ کرد بۆ بڵاوکردنەوە، ئاگاداری نووسەرەکەی دەکاتەوە، بەڵام لەکاتێکدا بڵاونەبوویەوە، پەیوەست نین بە ئاشکرا کردنی هۆکاری بڵاونەبوونەوەی.

-6 بابەتە بڵاوکراوەکان دەبنە موڵکی گۆڤار و هەر کاتێك بیەوێ بڵاوی دەکاتەوە، لە هەر توێژینەوە و پەڕتووکێکیش پێی گونجاو بێ، بە زمانی خۆی یان وەرگێڕدراو بۆ هەر زمانێکی دیکە بڵاوی دەکاتەوە.

تکایە بابەتەکان تەنها بۆ ئەم ئیمەیلەی خوارەوە بنێرن:

Govari.raha@gmail.com

